# تەوحید

## لە (١٠٠) پرسیار و وەڵامدا




کۆکردنەوە وئامادەکردنی

عبدالعزیز بن محمد الشعلان

زانای ناودار

"صالح بن فوزان الفوزان" پێشەکی بۆ نوسیوە

وەرکێرانی

عثمان أحمد حاتم

# تەوحید

## لە (١٠٠) پرسیار و وەڵامدا


کۆکردنەوە وئامادەکردنی

عبدالعزیز بن محمد الشعلان

زانای ناودار

"صالح بن فوزان الفوزان" پێشەکی بۆ نوسیوە

وەرگێرانی

عثمان أحمد حاتم



شوال - ١٤٤٣هـ

## پێشەكی وەرگێر

ئەم ناميلكەيە (١٠٠) پرسيار ووەڵامە دەربارەی تەوحيد وباوەڕ وئيسلام وچاكەكاری وكۆمەڵێك بابەتی گرنگی تری پەيوەست بە بيروباوەڕەوە ، شێخ "عبدالعزيزی كوڕی محمد الشعلان" نوسيويەتی ، وزانای ناودار صالح الفوزان پێشەكی بۆ نوسيوە وبەباشە باسيكردووە ، وبە زمانێكی ئاسان نوسراوە ودارِێژراوە ، هەموو موسڵمانێك وبەتايبەت لاو وتازەپێگەيشتوەكان پێويستە ئەو پرسيارانە ووەڵامەكانيان بزانن .

عثمان أحمد حاتم

١/ذوالقعدة/١٤٤٣

٢٠٢٢/٦/١

**بەناوی خودای میهرەبانی بەبەزەیی**

سوپاس بۆ خودا ، دواتر : ئەم پرسیار ووەڵامەم خوێندەوە کە شێخ "عبدالعزیزی کوڕی محمد الشعلان" نوسیویەتی ، وکتێبی (أصول ثلاثة) و(القواعد الأربعة) تیّدا هێناوە کە نوسینی پێشەوای موجەدید "محمدی کوڕی عبدالوهابە رحمه الله" ، بینیم نوسینێکی باش وبەسودە بۆ ناسینی ئەم کتێبە مەزنە ، ولە بیرەکان نزیکی دەکاتەوە ، خودا پاداشتی بداتەوە وبەزانستەکەی سود بگەیەنێت .

نوسینی
صالح بن فوزان الفوزان
ئەندامی دەستەی گەورە زانایان
لە ١٤٤٠/٣/٢١هـ




**بە ناوی خودای میهرەبانی بەبەزەیی**

سوپاس بۆ پەروەردگاری هەموو دروستکراوەکان ، ودرود وسەلام لەسەر بەڕێزترین پێغەمبەران وڕەوانەکراوەکانی خودا ... دواتر :

ئەمە پرسیار ووەڵامە لە بنەمای بنەماکان بە تاك وتەنها پەرستنی خودا ﷻ ، وئاگادارکردنەوە لە دژەکەی کە هاوبەش بڕیاردانە بۆ خودا وئامرازەکانی ، ودەربارەی بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت وجەماعەت ، بە شێوەیەکی کورت دامڕشتووە ، وڕەچاوی ئەوەم تێدا کردووە تێگەیشتنی ئاسان بێت لای خوێنەر ، داواکارم خودا ﷻ بە هۆیەوە سود بە خوێنەرانی بگەیەنێت .

عبدالعزيز بن محمد الشعلان

## بیروباوەڕی تەنها پەرستنی خودا بە پرسیار ووەڵام

**پ١/ بۆچی تەوحید دەخوێنین ؟**

و١/ چونکە بنەمای بنەماکانە ، وخودا لەو پێناوەدا جن ومرۆڤی دروستکردووە ، وپێغەمبەرانی ڕەوانەکردووە ، وکتێبەکانی دابەزاندووە ، وبەهەشت ودۆزەخ دانراوە ، وخەڵك دابەش بوون بۆ باوەڕداران وبێباوەڕان ، خودا ﷻ دەفەرموێت : ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ۝٥٦﴾(الذَّارِيَات).

واتە : جن ومرۆڤم دروست نەکردووە بۆ ئەوە نەبێت بە تەنها بمپەرستن .

**پ٢/ لە کوێوە بیروباوەڕمان وەردەگرین ؟**

و٢/ لە قورئان وسوننەت وئەوەی سەلەفی ئوممەت لەسەری بوون .




**پ٣/ ئەو سێ بنەما چین کە پێویستە مرۆڤ بیزانێت ، ولە گۆڕەکەیدا پرسیاری لێدەکرێت دەربارەیان ؟**

و٣/ بریتییە لە ناسینی پەروەردگاری ، وئاینەکەی ، وپێغەمبەرەکەی محمد ﷺ .

**پ٤/ کێ پەروەردگارتە ؟**

و٤/ پەروەردگارم خودایە کە پەروەردەی کردووم ، وهەموو دروستکراوەکانی پەروەردە کردووە بە نیعمەتەکانی ، کە پەرستراومە ، جگە لە ئەو پەرستراوی ترم نییە ، وبەڵگەش لەسەر ئەوە خودا ﷻ دەفەرموێت : ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾(الفَاتِحَة).

واتە : سوپاس وستایش بۆ خودای پەروەردگاری هەموو بوونەوەر .

**پ٥/ بەچی پەروەردگارت ناسی ؟**

و٥/ ناسیم بە بەڵگە ونیشانە ودروستکراوەکانی ، ولە بەڵگە ونیشانەکانی شەو ورۆژ وخۆر ومانگە ، ولە دروستکراوەکانی حەوت

ئاسمانه‌كه وئه‌وه‌ی تێیاندایه ، وحه‌وت چینه‌كه‌ی زه‌وی وئه‌وه‌ی تێیاندایه وله نێوانیاندایه ، به‌ڵگه له‌سه‌ر ئه‌وه خودا ﷻ ده‌فه‌رموێت : ﴿وَمِنۡ ءَايَٰتِهِ ٱلَّيۡلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُۚ لَا تَسۡجُدُواْ لِلشَّمۡسِ وَلَا لِلۡقَمَرِ وَٱسۡجُدُواْ لِلَّهِ ٱلَّذِي خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمۡ إِيَّاهُ تَعۡبُدُونَ ٣٧﴾(فُصِّلَت).

واته : وله به‌ڵگه ونیشانه‌كانی خودا شه‌و ورۆژ وخۆر ومانگه ، سوژده نه‌بۆ مانگ ونه‌بۆ خۆر ببه‌ن ، به‌ڵكو سوژده بۆ خودا ببه‌ن كه دروستی كردوون ، ئه‌گه‌ر ئێوه خودا ده‌په‌رستن .

**پ٦/ خودا له كوێیه ؟**

و٦/ له ئاسمانه به‌سه‌ر عه‌رشدا به‌رز وبلنده .

**پ٧/ به‌ڵگه چییه له قورئاندا كه خودا ﷻ له ئاسمانه له‌سه‌ر عه‌رش ؟**

و٧/ به‌ڵگه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی له ئاسمانه ، ئه‌وه‌یه كه خودا ده‌فه‌رموێت : ﴿ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ ١٦﴾(المُلْك).




واتە : ئایا ئێوە ئەمینن لە سزای خوا کە لە ئاسمانە؟.

وبەڵگە لەسەر ئەوەی لەسەر عەرشە ، خودا ﷻ دەفەرمویت: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ۝٥﴾(طه).

واتە : خودای میهرەبان بەرز وبلّندە بەسەر عەرشدا ؛ ولە حەوت شوێن لە قورئاندا هاتووە .

**پ٨/ مانای (استوی) چییە ؟**

و٨/ بەرزە وبلّندە وسەرکەتووە وجێگیربووە .

**پ٩/ بۆچی خودا جن ومرۆڤی دروست کردووە ؟**

و٩/ بۆ پەرستنی بە تاك وتەنها وهاوبەش بڕیارنەدان بۆی .

**پ١٠/ بەڵگە چییە لە قورئان لەسەر ئەوەی خودا جن ومرۆڤی بۆ پەرستنی دروست کردووە ؟**

و١٠/ ئه‌و ئایه‌ته‌یه که خودا ﷻ ده‌فه‌رمویّت : ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ۝٥٦﴾(الذَّارِيَات).

واته : جن ومرۆڤم دروست نه‌کردووه بۆ ئه‌وه نه‌بیّت به ته‌نها بمپه‌رستن .

**پ١١/ مانای (یعبدون) چییه ؟**

و١١/ مانای به‌ته‌نها په‌رستنی خودایه .

**پ١٢ / په‌رستن چییه ؟**

و١٢/ ناویّکی کۆکه‌ره‌وه‌یه بۆ هه‌موو ئه‌وه‌ی خودا خۆشی ده‌ویّت ولیّی ڕازییه : له گوفتار وکرداره په‌نهانه وئاشکراکان .

**پ١٣/ مانای شه‌هاده‌تی (لا إله إلا الله) چییه ؟**

و١٣/ مانای ئه‌وه‌یه : هیچ په‌رستراویّکی حه‌ق نییه جگه له خودا .

**پ١٤/ مانای شه‌هاده‌تی (محمد رسول الله) چییه ؟**

و١٤/ گوێڕایەڵی کردنییەتی لەوەی فەرمانی پێکردووە ، وبە ڕاستزانینی ئەوەی هەواڵی لە بارەوەداوە ، ودوورکەوتنەوەی لەوەی نەهیی لێکردووە ، وخودا پەرستی نەکرێت بەوە نەبێت کە کردوویەتی بە شەرع .

**پ١٥/ گەورەترین شتێك کە خودا ﷻ فەرمانی پێکردووە چییە ؟**

و١٥/ گەورەترین شت کە خودا ﷻ فەرمانی پێکردووە تەوحیدە ، کە بریتییە لە : پەرستنی بە تاك وتەنها وهاوبەش بۆ بڕیار نەدانی .

خودا ﷻ دەفەرموێت : ﴿وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ﴾(النَّحل).

واتە : بێگومان پێغەمبەرمان بۆ هەموو ئوممەتێك ناردووە ، بۆ ئەوەی خودا بپەرستن ودوورکەونەوە لە شەیتان وهەموو بت وپەیکەر وکەسانێکی یاخی ولە سنور دەرچوو .

**پ١٦/ جۆرەکانی تەوحید چین ؟**

و١٦/ ته‌وحيدى په‌روه‌ردگاريّتى ، ته‌وحيدى په‌رستراويّتى ، وته‌وحيدى ناو وسيفه‌ته‌كان .

**پ١٧/ پێناسه‌ى ته‌وحيدى په‌روه‌ردگاريّتى چيیه ؟**

و١٧/ بريتييه له : به تاك وته‌نها دانانى خودا له كرداره‌كانى ، وه‌ك : دروستكردن ، ورِۆزيدان ، وباران باراندن ... هه‌تاكۆتايى .

**پ١٨/ پێناسه‌ى ته‌وحيدى په‌رستراويّتى چيیه ؟**

و١٨/ بريتييه له : به تاك وته‌نها دانانى خودا له كرده‌وه‌ى به‌نده‌كان كه كردوويه‌تى به‌شه‌رع بۆيان ، وه‌ك : پارِانه‌وه ، وئاژه‌ڵ سه‌ربرِين ، وسوژده .

**پ١٩/ پێناسه‌ى ته‌وحيدى ناو وسيفه‌ته‌كان چيیه ؟**

و١٩/ بريتييه له به تاك وته‌نها دانانى خودا ﷻ به‌و ناو وسيفه‌تانه‌ى تايبه‌تن به خوداوه .

خودا ﷻ دەفەرمويّت : ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾(الشُّورَىٰ).

واتە : هيچ شتيّك لە خودا ناچيّت ، وخودا بيسەر وبينايە .

**پ٢٠/ باسى هەنديّك جۆرى پەرستن بكە ؟**

و٢٠/ لە جۆرەكانى : پاڕانەوە ، داواى بە هاناوەچوون ، داواى يارمەتيدان ، سەربڕينى قوربانى ، نەزر ، ترس ، ئوميّد ، پشت پيّبەستن ، تەوبە وگەڕانەوە ، خۆشويستن ، ويست ، ڕكوع ، سوژدە ، خشوع ، وزەليلى ، زيكر ، وقورئان خويّندن .

**س٢١/ گەورەترين تاوان كە خودا نەهى ليّكردووە چييە ؟**

پ٢١/ گەورەترين تاوان كە خودا نەهى ليّكردووە هاوبەش بڕياردانە (شرك) ، كە بريتييە لە : پەرستنى جگە لە خودا لەگەڵ خودا ، خودا ﷻ دەفەرمويّت : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ ﴿٤٨﴾﴾(النِّسَاء).

واته : بێگومان خودا خۆش نابێت لـه هاوبەش بڕیاردان ، وخۆش دەبێت لـه هەر تاوانێك جگە لـه هاوبەش دانان بۆ هەر كەسێك كە بیەوێت .

**پ٢٢/ دوو جۆرەكەی هاوبەش بڕیاردان كامانەن ؟**

و٢٢/ جۆری یەكەم : هاوبەش بڕیاردانی گەورە : بریتییه لـه هەموو ئەوەی خودا ﷻ وپێغەمبەرەكەی ﷺ ناوی هاوبەش بڕیاردانیان لێناوە ، وخاوەنەكەی لـه ئیسلام دەردەكات ، وەك : پەرستنی بتەكان ومردووەكان ، وسوژدەبردن بۆ جگە لـه خودا .

جۆری دووەم : هاوبەش بڕیاردانی بچووك : بریتییه لـه هەموو ئەوەی لـه شەریعەتدا هاتووە كە هاوبەش بڕیاردانە وخاوەنەكەی لـه ئیسلام دەرناكات ، وەك : سوێند خواردن بە جگە لـه خودا ، وڕووپامای كەم ، وگوتەی : ئەگەر خودا بیەوێت وتۆ بتەوێت ؛ وپێی گوتراوە : هاوبەش بڕیاردانی بچووك ، چونكە ئامرازە بۆ كەوتنە نێو هاوبەش بڕیاردانی گەورەوە .

**پ٢٣/ كەی یەكەم هاوبەش بڕیاردان ڕوویداوە لە نێو خەڵكدا .**




و٢٣/ یەکەم هاوبەش بڕیاردان لە نێو خەڵکدا لە گەلەکەی پێغەمبەر نوحدا ﷺ ڕوویداوە .

**پ٢٤/ هۆکاری ڕوودانی هاوبەش بڕیاردان لە نێو گەلەکەی پێغەمبەر نوح ﷺ چی بوو ؟**

و٢٤/ هۆکارەکەی ڕۆچوون بوو لە پیاوچاکان .

**پ٢٥/ مانای ڕۆچوون لە پیاوچاکان چییە ؟**

و٢٥/ بریتییە لە زیادەڕۆیکردن لە پیاهەڵدان ، وبەرزکردنەوەیان زیاتر لە پلەوپایەی خۆیان ، بەوەی هەندێك پەرستنیان بۆ بکرێت ، بەڵگەش لەسەر ئەوە خودا ﷻ دەفەرموێت : ﴿يَـٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَـٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ﴾(النِّسَاء).

واتە : ئەی خاوەن کتێبەکان زیادەڕۆیی مەکەن لە ئاینەکەتاندا .

وپێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت:((**لاَ تُطْرُونِي ، كما أطْرَتْ النَّصارى ابْنَ مَرْيَمَ ، إنَّما أنا عَبْدٌ ، فَقُولُوا عَبْدُ اللَّهِ ورَسُولُهُ**))رواه البخارى .

واته : لـه پیاهەڵـدانمدا ڕۆمەچن ، وەك چۆن گاورەكان لـه پیاهەڵدانی عیسای كوڕی مەریەمدا ڕۆچوون ، به دڵنیاییەوه من بەندەم ، بڵێن : بەندە وپێغەمبەری خودا .

**پ٢٦/ حوكمی پاڕانەوه له مردوو چییه ؟**

و٢٦/ پاڕانەوه لـه مردوو وجگه لـەوانیش لـەوشتانەی تەنها لـه توانای خودادایه هاوبەش بڕیاردانی گەورەیه وخاوەنەكەی لـه ئیسلام دەردەكات ، بەڵگەی ئایەتی قورئان لـەسەر ئەوه ، خودا ﷻ دەفەرموێت : ﴿وَمَن يَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرْهَـٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿١١٧﴾﴾(المُؤْمِنُون).

واته : هەركەسێك لـەگەڵ خودا پەرستراوێكی تر بپەرستێت ولـێی بپاڕێتەوه ، هیچ بەڵگەی بەدەستەوه نییه لـەسەر ئەو كردەوەیه ، بێگومان لـێپرسینەوەی لای پەروەردگاریەتی لـەسەر هاوبەش بڕیاردانی ، بەدڵنیایەوه بێباوەڕان




سەرفرازنابن ورزگاريان نابێت ، ودووچاری سزا وئازاری سەختی دۆزەخ دەبنەوە .

**پ٢٧/ ئايا پارانەوە لە خودا پێويستی بە نێوانگيری دروستكراو هەيە ؟**

و٢٧/ پارانەوە لە خودا پێويستی بە نێوانگيری دروستكراو نييە ، بەڵگەش لەسەر ئەوە خودا ﷻ دەفەرموێت : ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌۖ أُجِيبُ دَعۡوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِۖ ﴿١٨٦﴾﴾(البَقَرَة).

واتە : ئەی پێغەمبەری خودا ئەگەر بەندە باوەڕدارەكانم پرسياريان دەربارەی من لێكرديت ئەوا من نزيكم ووەڵامی پارانەوەی ئەو كەسانە دەدەمەوە كە لێم دەپارێنەوە .

**پ٢٨/ ئايا مردووەكان وەڵامی پارانەوە دەدەنەوە ؟**

و٢٨/ مردووەكان وەڵامی پارانەوە نادەنەوە ، بەبەڵگەی ئەو ئايەتەی خودا ﷻ دەفەرموێت : ﴿إِن تَدۡعُوهُمۡ لَا يَسۡمَعُواْ دُعَآءَكُمۡ وَلَوۡ سَمِعُواْ مَا ٱسۡتَجَابُواْ لَكُمۡۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَكۡفُرُونَ بِشِرۡكِكُمۡۚ ﴿١٤﴾﴾(فَاطِر).

واته : ئه‌گه‌ر لـێیان بپاڕێنه‌وه ، پاڕانه‌وه‌كانتان نابیستن ، وئه‌گه‌ر بشبیستن وه‌ڵامتان ناده‌نه‌وه ، ولـه ڕۆژی قیامه‌تدا خۆیان بێبه‌ری ده‌كه‌ن لـه هاوبه‌ش بڕیاردانه‌كانتان .

**پ٢٩/ بۆ كێ ئاژه‌ڵ سه‌ربڕین ونوێژ بكه‌ین ؟**

و٢٩/ بۆ خودا ﷻ به ته‌نها كه هاوبه‌شی نییه ، خودا ﷻ ده‌فه‌رموێت : ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ۝٢﴾(الكَوثَر).

واته : نوێژ بۆ په‌روه‌ردگارت بكه وئاژه‌ڵی بۆ سه‌ربڕه .

**پ٣٠/ حوكمی سه‌ربڕینی ئاژه‌ڵ وسوژده بردن بۆ جگه له خودا چییه ؟**

و٣٠/ هاوبه‌ش بڕیاردانی گه‌وره‌یه ، وخاوه‌نه‌كه‌ی لـه ئومه‌تی ئیسلام ده‌رده‌كات .

خودا ﷻ ده‌فه‌رموێت : ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝١٦٢ لَا شَرِيكَ لَهُۥ ۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ ۝١٦٣﴾(الأَنعَامِ).




واته : بلێ : به دڵنیاییەوه نوێژ وسەربڕینی ئاژەڵ وژیان ومردنم بۆ خودای پەروەردگاری هەموو دروستکراوەکانه ؛ هیچ هاوبەشێکی نییه ، وبەوە فەرمانم پێکراوه ، ومن یەکەم موسڵمانم لـه ئوممەتەکەم ، یان من یەکەم کەسم که دان بەوەدا دەنێم وملکەچ وگوێڕایەڵم لـەم ئوممەته بۆ پەروەردگارم که هیچ هاوبەشی نییه .

**پ٣١/ حوکمی سوێند خواردن به جگه له خودا چییه ، وەك سوێند خواردن به پێغەمبەری خودا ﷺ یان به ئەمانەت ، یان به شەرەف ، یان به جگه لەوانه چییه ؟**

و٣١/ حوکمەکەی هاوبەش بڕیاردانی بچووکه ؛ پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((مَن كانَ حالِفًا ، فَلْيَحْلِفْ بِاللَّهِ أَوْ لِيَصْمُتْ))رواه البخاری.

واته : هەرکەسێك سوێندی خوارد، باسوێند به خوا بخوات یان بێدەنگ بێت.

**پ٣٢/ چی پێویسته لەسەر موسڵمان دەربارەی ناو وسیفەتەکانی خودا ﷻ ؟**

و٣٢/ دانپێدانانی ئه‌وه‌ی خودا ﷻ بۆ نه‌فسی دایناوه ، یان پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی ﷺ بۆی داناوه ، ونه‌فیكردنی ئه‌وه‌ی له نه‌فسی خۆی نه‌فی كردووه ، یان پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی ﷺ نه‌فیكردووه لێی له ناو وسیفه‌ته‌كانی ، به‌بێ تێكدانی مانا وله‌كارخستن وچۆنییه‌تی وچواندنی .

**پ٣٣/ به‌ڵگه چییه له قورئان له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی سیفه‌ته‌كانی خودا ﷻ له سیفه‌ته‌كانی ئێمه ناچێت ؟**

و٣٣/ ئه‌و ئایه‌ته‌یه كه خودا ﷻ ده‌فه‌رموێت : ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١١﴾(الشُّورَىٰ).

واته : هیچ شتێك له خودا ناچێت ، وخودا بیسه‌ر وبینایه .

**پ٣٤/ ئاینی تۆ چییه ؟**

و٣٤/ ئاینم ئیسلامه ، به‌ڵگه‌ش ئه‌و فه‌رمووده‌ی خودایه ده‌فه‌رموێت : ﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ﴾(آلِ عِمۡرَان).

واتە : بێگومان ئەو ئاینەی کە پەسەندە لای خودا تەنها ئاینی ئیسلامە .

**پ٣٥/ ئایا خودا ﷻ ئاینێکی تر جگە لە ئاینی ئیسلام ، دوای ڕەوانە کردنی محمد ﷺ قەبوڵ دەکات ؟**

و٣٥/ خودا ﷻ هیچ ئاینێك جگە لە ئاینی ئیسلام قەبوڵ ناکات دوای ڕەوانە کردنی پێغەمبەری خودا ﷺ ، بە بەڵگەی ئەو ئایەتەی خودا ﷻ دەفەرموێت : ﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾﴾(آلِ عِمْرَان).

واتە : هەرکەس جگە لە ئاین وشەریعەتی ئیسلام خوازیاری ئاینێکی تر بێت لێی وەرناگیرێت ولە ڕۆژی قیامەتدا لە زیانمەندان دەبێت .

**پ٣٦/ پێناسەی ئیسلام چییە ؟**

و٣٦/ ئیسلام بریتییە لە : ملدان بۆ خودا بە تاك وتەنها پەرستنی ، وملکەچبوونی بە گوێڕایەڵی کردنی ، وبێبەری بوون لە هاوبەش بڕیاردان وهاوبەش بڕیاردەران .

**پ٣٧/ پایەکانی ئیسلام چین ؟**

و٣٧/ بریتین لە : شەهادەتدان کە هیچ پەرستراوێك نییە جگە لە خودا شایانی پەرستن بێت بە حەق ، ومحمد ﷺ بەندە وپێغەمبەری خودایە ، وئەنجامدانی نوێژەکان ، وبەخشینی زەکات ، وڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان ، وحەجی ماڵی خودا بۆ هەرکەسێك بتوانێت .

بەڵگەش ئەو فەرموودەیە کە پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((**الإسلامُ أن تَشْهَدَ أن لا إلهَ إلا اللّهُ وأن محمدًا رسولُ الله ، وتُقيمَ الصلاةُ ، وتُؤْتِيَ الزكاةَ ، وتَصومَ رمضانَ ، وتَحُجَّ البيتَ إن استطعْتَ إليه سبيلًا**)) رواه البخاری ومسلم .

واتە : ئیسلام بریتییە لەوەی : شایەتیبدەیت کە هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق جگە لە خودا ، ومحمد ﷺ پێغەمبەری خودایە ، ونوێژ بەجێ بهێنیت ، وزەکاتی سامانت ببەخشیت ، وڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگریت ، وحەجی ماڵی خودا بکەیت ئەگەر لە تواناتدا هەبوو .




**پ٣٨/ پێناسەی باوەڕ چییە ؟**

و٣٨/ بریتییە : لـە قسەی زمان ، وباوەڕی دڵ ، وکردارکردن بە ئەندامەکان ، بەگوێڕایەڵی زیاد دەکات ، وبە تاوان کەم دەکات .

**پ٣٩/ پایەکانی باوەڕ چین ؟**

و٣٩/ بریتییە لـە : باوەڕ بە خودا وفریشتەکانی وکتێبەکانی وپێغەمبەرەکانی وڕۆژی دوای ، وباوەڕ بە قەدەری خێر وشەڕ ، بەڵگە ئەو فەرموودەیە کە پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((الإِيمَانُ أَنْ تُؤْمِنَ بِاللهِ ، ومَلائِكَتِهِ ، وكُتُبِهِ ، ورُسُلِهِ ، واليَوْمِ الآخِرِ ، وتُؤْمِنَ بِالقَدَرِ خَيْرِهِ وشَرِّهِ)) رواه مسلم .

واتە : باوەڕ بریتییە لـەوەی : باوەڕت بە خودا ﷻ ، وفریشتەکانی ، وکتێبەکانی ، وپێغەمبەرەکانی ، وڕۆژی دوایی ، وقەدەری خێر وشەڕ هەبێت.

**پ٤٠/ فریشتە کێن ؟**

و٤٠/ فریشتە جیهانێکی پەنهانن خودا بۆ پەرستنی دروستی کردوون .

**پ٤١/ حوكمی باوەڕ بە فریشتە چییە ؟**

و٤١/ باوەڕ بە فریشتە واجبە ، وباوەڕ قەبوڵ نابێت بەبێ باوەڕ بوون بە فریشتەكان .

**پ٤٢/ كام فریشتە باشترینە ؟**

و٤٢/ جبریل عليه السلام باشترین فریشتەیە، وڕاسپێردراوە بە دابەزاندنی وەحی .

**پ٤٣/ كتێبە ئاسمانییەكان چین ؟**

و٤٣/ بریتییە لەو كتێبانەی خودا سبحانه وتعالى دایبەزاندووە بۆ پێغەمبەرانی عليهم السلام ، وەك : تەورات ، وئینجیل ، وزەبور ، وقورئان .

**پ٤٤/ حوكمی باوەڕ بە كتێبە ئاسمانییەكان چییە ؟**

و٤٤/ باوەڕ بە كتێبە ئاسمانییەكان واجبە وباوەڕ قەبوڵ نابێت بەبێ باوەڕ بوون بە كتێبە ئاسمانییەكان .




**پ٤٥/ كام كتێب گەورەترین كتێبی ئاسمانییە ؟**

و٤٥/ گەورەترین كتێب بریتییە لە : قورئانی مەزن كە خودا ﷻ دایبەزاندووە بۆ **محمد** ﷺ .

كە نەسخی هەموو كتێبە ئاسمانییەكانی تری كردووەتەوە ، وپەرستن بە جگە لە قورئان دروست نییە ، خودا ﷻ دەفەرموێت : ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ ﴿٤٨﴾﴾(المَائِدَة).

واتە : وئێمە كتێبمان بۆ دابەزاندووی كە ڕاست وڕەوایە وسەلمێنەر وپشت ڕاستكەرەوەی كتێبەكانی پێش خۆیەتی وحاكم وبالأیە بەسەریاندا وشەریعەتەكانی نەسخ كردوونەتەوە .

**پ٤٦/ ڕۆژی دوای چییە ؟**

و٤٦/ بریتییە لە ڕۆژی قیامەت كە خەڵكی تێدا زیندوو دەكرێتەوە بۆ لێپرسینەوە وپاداشت وەرگرتنەوە .

**پ٤٧/ حوکمی باوه‌ڕ به ڕۆژی دوای چییه ؟**

و٤٧/ باوه‌ڕ به ڕۆژی دوای واجبه ، وباوه‌ڕ قه‌بوڵ نابێت به‌بێ باوه‌ڕ بوون به ڕۆژی دوای .

**پ٤٨/ مانای باوه‌ڕ به قه‌ده‌ر چییه ؟**

و٤٨/ قه‌ده‌ر بریتییه : له‌وه‌ی خودا ﷻ بۆ دروستکراوه‌کانی داناوه له پێشدا به‌گوێره‌ی ئه‌وه‌ی خودا ویستوویه‌تی به‌زانست ودانایی .

**پ٤٩/ حوکمی باوه‌ڕ به قه‌ده‌ر چییه ؟**

و٤٩/ باوه‌ڕ به قه‌ده‌ر واجبه، وباوه‌ڕ قه‌بوڵ نابێت به‌بێ باوه‌ڕ بوون به قه‌ده‌ر .

**پ٥٠/ چاکه‌کاری چییه ؟**

و٥٠/ چاکه‌کاری بریتییه له ئه‌وه‌ی : خودا بپه‌رستی وه‌ك ئه‌وه‌ی ببینی ، وئه‌گه‌ر نه‌یبینی دڵنیابیت له‌وه‌ی خودا تۆ ده‌بینێت .

**پ٥١/ پێناسەی ڕیبا چییە ؟**

و٥١/ ڕیبا بریتییە لە : ئەنجامدانی پەرستن لە پێناوی ئەوەی خەڵك ببینن وپێدا هەڵبدەن .

**پ٥٢/ حوکمی ڕیبا چییە ؟**

و٥٢/ ڕیبا حەرامە ، ولە هاوبەش بڕیاردانی بچووکە .

بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((**أخوفُ ما أخافُ عليكمُ الشرك الأصغر ، فسُئِلَ عنه ، فقال : الرياءُ**)) رواه أحمد وصححه الألباني.

واتە : ئەوەی زۆر دەترسم تووشتان ببێت هاوبەش بڕیاردانی بچووکە ، پرسیاریان دەربارەی ئەوە لێکرد ، فەرمووی : ڕیبایە .

**پ٥٣/ پێغەمبەرت کێیە ؟**

و٥٣/ پێغەمبەرم : محمدی کوڕی عبداللەی کوڕی عبدالمتلبی کوڕی هاشمە ، وهاشم لە هۆزی قورەیشە ، وقورەیش لە کینانەیە ، وکینانە لە

نەتەوەی عەرەبە ، وعەرەب لە نەوەی پێغەمبەر ئیسماعیلن ، وئیسماعیل کوڕی پێغەمبەر ئیبراهیمە ﷺ .

**پ٥٤/ گەورەترین بەڵگەی پێغەمبەرایەتییەکەی چییە ؟**

و٥٤/ گەورەترین بەڵگەی پێغەمبەرایەتییەکەی قورئانی مەزنە ، کە فەرموودەی خودایە ، وهیدایەت وچارەسەر ونورە .

خودا ﷻ دەفەرموێت : ﴿قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا ٨٨﴾(الإِسْرَاء).

واتە : ئەی پێغەمبەری خودا بڵێ : ئەگەر مرۆڤ وجن هەموویان کۆ ببنەوە بۆ ئەوەی هاوشێوەی ئەم قورئانە بهێنن ، ناتوانن هاوشێوەی بهێنن ، ئەگەر هەمووان پشتیوانبن ویارمەتیدەری یەکتربن بۆ ئەو مەبەستە .

**پ٥٥/ گەورەترین مافی پێغەمبەری خودا ﷺ چییە ؟**

و٥٥/ گەورەترین مافی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوەیە باوەڕی ڕاستت پێی هەبێت ، کە خودا ڕەوانەی کردووە بۆ جن وهەموو مرۆڤ ، وپێویستە گوێڕایەڵی بکرێت وسەرپێچی فەرمانەکانی نەکرێت ، وشوێنی بکەون وچاوی لێ بکەن وسوننەتەکەی بەگەورە دابنێن ، وخۆشویستنی وڕێز لێگرتنی ﷺ ، وزیادەڕۆی نەکردن وبەرز نەکردنەوە زیاتر لەو پلەوپایەی خۆی کە خودا ﷻ پێی بەخشیووە .

**پ٥٦/ سیحر چییە ؟**

و٥٦/ سیحر بریتییە لە : کردارێکی شەیتانی وکاریگەری لەسەر دڵ ولاشە هەیە بە حەقیقەت ، وجۆری وای هەیە خەیاڵە وکاریگەری لەسەر بینین هەیە وحەقیقەتی نییە .

**پ٥٧/ فاڵگرتنەوە چییە ؟**

و٥٧/ فاڵگرتنەوە بریتییە لە : بانگەشەی زانستی پەنهان (غیب) کردن بە بەکارهێنانی جن .

**پ٥٨/ ئەستێرەناسی چییە ؟**

و٥٨/ ئەستێرەناسی بریتییە لە : بانگەشەی زانینی پەنهان (غیب) بە کۆمەڵە پێشەکییەك دەکرێتە بەڵگە بۆ زانینی شوێنی شتی دزراو ، ون بوو.

وگوتراوە ئەستێرەناس (العراف) : ناوێکە بۆ فاڵگر (کاهن) و(منجم) و(رمال) وهاوشێوەی ئەوانە ، لەوانەی قسە لە کاروباری پەنهان دەکەن بە یارمەتی جن .

**پ٥٩/ حوکمی ڕۆیشتن بۆ لای فاڵگر وئەستێرەناس وجگە لەوانیش چییە ، کە بانگەشەی زانینی زانستی پەنهان (غیب) دەکەن ؟**

و٥٩/ ڕۆیشتن بۆ لای جادووگەر وفاڵگر وئەستێرەناس حەرامە ، لە صەحیحی مسلمدا هاتووە پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((مَن أتى عَرّافًا فَسَألَهُ عَنْ شَيْءٍ ، لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلاةٌ أرْبَعِينَ لَيْلَةً)).

واتە : هەرکەسێك بچێت بۆ لای فاڵگرەوەیەك وپرسیاری شتێکی لێ بکات ، چل ڕۆژ نوێژی لێ قەبوڵ ناکرێت .




وئەبوهورەیرە رضي الله عنه دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((من أَتى عَرّافًا أو كاهنًا فصَدَّقه فِيمَا يَقولُ ، فقد كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ على مُحَمَّدٍ ﷺ)) رواه أحمد وأبوداود والترمذي .

واتە : هەرکەسێك بچێت بۆ لای فاڵگرێك یان ئەستێرەناسێك ، ئەوەی دەیلێت بە ڕاستی بزانێت ، بێگومان کافر بووە بەوەی کە بۆ محمد ﷺ دابەزیوە .

**پ٦٠/ حوکمی جادوو (سحر) وفێربوونی چییە ؟**

و٦٠/ جادوو هەمووی حەرامە وکوفرە ، فێربوون وفێرکردنی ، هیچ شتێکی حەڵاڵ نییە ، خودا سبحانه وتعالى دەفەرموێت : ﴿وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ ١٠٢﴾(البَقَرَة).

واتە : وپێغەمبەر سلیمان بێباوەڕ نەبوو بەڵکو شەیتانەکان بێباوەڕبوون کە جادوویان فێری خەڵك دەکرد .

**پ٦١/ حوكمی خوێندنەوەی بورجەكانی بەخت وئاینده ، وبە ڕاست زانینیان چییه ؟**

و٦١/ بریتییه لـه كردارەكانی سەردەمی نەفامی ، ولـه ژێر بابەتی به ڕاستزانینی فاڵگر وئەستێرەزانەكانه ، كه بانگەشەی زانینی زانستی پەنهان (غیب) دەكەن ، پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((من اقتبسَ عِلماً منَ النُّجومِ اقتبسَ شعبةً منَ السِّحرِ زادَ ما زادَ)) رواه أبوداود وإسناده صحيح .

واته : هەركەسێك زانستێك لـه ئەستێرەناسی فێربێت كه بانگەشەی زانستی پەنهانی پێدەكرێت ، بەشێك لـه جادووگەری فێربووه ، وئەگەر زیاتر فێربێت جادووەكەی زیاد دەكات .

**پ٦٢/ پێناسەی نوشته ، چاوەزار (التمیمة) چییه ؟**

نوشته ، چاوەزار : بریتییه لـه موورگ یان ئێسقان یان نوسین یان دەستبەند یان دەزوو یان دەستەسرٍ یان جگه لـەوانه ، بە گەردنی منداڵەوه




دەكرێت ، یان لـه قۆڵیان دەبەسترێت ، یان به خانوو یان به ئۆتۆمبێلـەوە هەڵدەواسرێت ، بەمەبەستی لادانی بەڵا وكارەسات پێش ئەوەی ڕووبدات ، یان لادانی دوای ئەوەی كه ڕوودەدات .

**پ٦٣/ حوكمی نوشته ، چاوەزار چییه ؟**

و٦٣/ هاوبەش بڕیادانی بچووكه ، ولـەوانەیه ببێته هاوبەش بڕیاردانی گەورە ، ئەگەر باوەڕی وابێت سود یان زیان دەگەیەنێت بەبێ خودا ﷻ .

به بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی كه پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((من علَّقَ تميمةً فقد أشرَكَ)) رواه أحمد وصححه الألباني .

واته : هەركەسێك نوشته ، چاوەزار ، هەڵبواسێت هاوبەشی بڕیارداوە .

**پ٦٤/ ڕوقییەی شەرعی چییه ، وحوكمی چییه ؟**

و٦٤/ بریتییه لـه خوێندنی قورئان بەسەر نەخۆشدا ، یان خوێندنی نزاوپاڕانەوە وفوكردن به شوێنی ئێش وئازارەكەدا ، وڕوقیەكردن دروسته ،

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((لا بأسَ بالرُّقى ما لم تكُنْ شِرگا)) رواه مسلم .

واته : ڕوقیەکردن ئاساییه ئەگەر هاوبەش بڕیاردانی تێدا نەبێت .

ومەرجە بۆ دروستی ڕوقیەکردن هاوبەش بڕیاردانی تێدا نەبێت ، وباوەڕی وابێت کە خودی خۆی کاریگەری نییە ، بەڵکو هۆکارە ، وسود وزیان بە دەستی خودایە ﷻ ، وبە زمانی عەرەبی بێت یان بە زمانێکی تر کە مانای زانراو بێت ، وبە فەرموودەی خودا وبە ناو وسیفەتەکانی خودا بێت.

**پ٦٥/ (الطيرة) چییە ؟**

و٦٥/ بریتییە لە : گەشبینی وڕەشبینی وبە شووم زانینی باڵندە (بەدقەدەمی ، وقەدەمخێری).

**پ٦٦/ حوکمی چییە بە بەڵگەوە ؟**

و٦٦/ حەرامە ولـە هاوبەش بڕیاردانی بچووکە ، ولـەوانەیە ببێتە هاوبەش بڕیاردانی گەروە ، ئەگەر باوەڕی وابێت سود وزیان دەگەیەنێت بەبێ خودا ﷻ ، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((**الطِّيَرَةُ شِركٌ**)) رواه أحمد وأبوداود .

واتە : گەشبینی وڕەشبینی وبە شووم زانینی باڵندە هاوبەش بڕیاردانە .

**پ٦٧/ ئایا (الطیرة) لە جگە لە باڵندەش ڕوودەدات ؟**

و٦٧/ بەڵێ ، وەك : بە شوومزانینی هەندێك مانگ ، یان هەندێك ڕۆژ ، یان هەندێك گیانلـەبەر ، وبەو کەسانەی کە لاشەیان هەندێك سیفەتی تێدایە ، وەك ئەو کەسەی چاوێکی کوێربێت یان شەل بێت ، وجگە لـەوانەشە .

**پ٦٨/ مانای داواکردنی باران لە ئەستێرەکان (الاستسقاء بالأنواء) چییە ؟**

و٦٨/ مانای ئەوەیە : داوای باران بارین بکرێت لـە ئەستێرەکان ، وئەگەر باران باری بارینی بدرێتە پاڵ ئەستێرەکان .

**پ٦٩/ حوکمی داوای باران بارین لە ئەستێرەکان چییە ؟**

و٦٩/ دوو جۆره :

یه‌كه‌م : باوه‌ڕی وابێت كه ئه‌ستێره‌كان باران ده‌بارێنن ، ئه‌مه كوفره ، وچونكه هاوبه‌ش بڕیاردانه بۆ خودا ﷻ .

دووه‌م : باوه‌ڕی وابێت كه خودا باران دروست ده‌كات وده‌یبارێنێت ، به‌ڵام باوه‌ڕی وایه ئه‌ستێره‌كان هۆكارن ، ئه‌مه هاوبه‌ش بڕیاردانی بچووكه ، چونكه نیعمه‌تی خودای ﷻ داوه‌ته پاڵ شتی تر ، وله‌به‌ر ئه‌وه‌ی خودا ﷻ ئه‌ستێره‌كانی نه‌كردووه‌ته هۆكاری باران بارین .

**پ٧٠/ به‌ڵگه چییه له‌سه‌ر حه‌رامی داوای باران بارین له ئه‌ستێره‌كان .**

و٧٠/ به‌ڵگه ئه‌و فه‌رمووده‌یه‌ی پێغه‌مبه‌ری خودایه ﷺ كه ده‌فه‌رموێت : خودا ﷻ ده‌فه‌رموێت : ((**مَن قالَ : مُطِرنا بِفضلِ اللهِ ورحمتِه ، فذلِكَ مُؤمِنٌ بِي ، كافرٌ بِالكواكِبِ ، وأمّا مَن قال : مُطِرنا بِنوءِ كذا وكَذا ، فذلِكَ كافِرٌ بِي ، ومُؤمِنٌ بِالكَواكِبِ**)) رواه البخاری ومسلم .




واته : هەركەسێك گوتی : بارانمان بۆ باری بە فەزڵ ورەحمەتی خودا ، ئەوە باوەڕی بە من هەیە ، وباوەڕی بەوە نییە ئەستێرەكان باران ببارێنن ، وهەركەسێك گوتی : بارانمان بۆ باری بەهۆی فلاّن ئەستێرە وفلاّن ئەستێرەوە ، ئەوە بێباوەڕە بە من ، وباوەڕی وایە ئەستێرەكان باران دەبارێنن .

**پ٧١/ حوكمی دروستكردنی مزگەوت لەسەر گۆڕ چییە ؟**

و٧١/ حەرامە وهۆكارێكە بۆ هاوبەش بڕیاردان ، پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((لَعْنَةُ اللَّهِ على اليَهُودِ والنَّصارى؛ اتَّخَذُوا قُبُورَ أنْبِيائِهِمْ مَساجِدَ)) رواه البخاری .

واته : نەفرەتی خودا لە جوولەكە وگاورەكان بێت گۆڕی پێغەمبەرەكانیان كردە مزگەوت .

**پ٧٢/ مانای تەبەڕوك چییە .**

و٧٢/ تەبەڕوك بریتییە لە : داوای بەرەكەت كە بەدەستهاتنی خێر وبەردەوامییەتی .

**پ٧٣/ جۆرەکانی تەبەڕوك کامانەن ؟**

و٧٣/ ١. تەبەڕوکی شەرعی : کە دروستە ، قورئان وسوننەت بەڵگەن لەسەری .

٢ . تەبەڕوکی قەدەغەکراو : کە حەرامە .

**پ٧٤/ جۆرەکانی تەبەڕوکی شەرعی چین ؟**

و٧٤/ تەبەڕوکی شەرعی دوو جۆرە :

١ . تەبەڕوك کردن بە شتە ماددییە هەست پێکراوەکان ، وەك تەبەڕوك کردن بە ئاوی زەمزەم .

٢ . تەبەڕوك کردن بە کردەوە باشەکان : وەك نوێژ وپاڕانەوە وبەخشین .

**پ٧٥/ جۆرەکانی تەبەڕوکی قەدەغەکراو چین ؟**

و٧٥/ تەبەڕوکی قەدەغەکراو دوو جۆرە :




١ . ئەوەیە شەریعەت نەهی لێکردووە ، وەك تەبەڕوك کردن بە بت وپەیکەرەکان .

٢ . ئەوەی هۆکاری خەیاڵین وحەقیقەتی نییە ، وەك تەبەڕوك کردن بە زاتی پیاوچاکان یان جلوبەرگیان یان لیکیان یان درەختەکان یان بەردەکان .

**پ٧٦/ جۆرەکانی تەوەسل لە پاڕانەوەدا چین ؟**

و٧٦/ تەوەسل لە دوعادا دوو جۆرە :

١ . تەوەسلی شەرعی : بریتییە لەو تەوەسلەی کە بەڵگە شەرعییەکان بەڵگەن لەسەری .

٢ . تەوەسلی قەدەغەکراو : بریتییە لەو تەوەسلەی بەڵگەی شەرعی لەسەر نییە یان نەهی لێکردووە .

**پ٧٧/ جۆرەکانی تەوەسلی شەرعی لە پاڕانەوەدا چین ؟**

و/ تەوەسلی شەرعی لە پاڕانەوەدا سێ جۆرە :

١ . تەوەسل کردن بە ناو وسیفەتەکانی خودا : وەك ئەوەی بڵێیت : یا ڕەحمان ڕەحمم پێ بکە .

٢ . تەوەسل بە کردەوەی چاکە : وەك ئەو ئایەتەی خودا ﷻ دەفەرموێت : ﴿رَبَّنَآ إِنَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ١٦﴾(آلِ عِمْرَان).

واتە : پەروەردگارمان ئێمە باوەڕمان هێناوە تاوانەکانمان بۆ ببۆشە ولێمان خۆشبە ولە سزای ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە .

٣ . تەوەسل کردن بە داواکردنی پاڕانەوە لە پیاوچاکێك کە زیندوو وئامادەیە ، وەك ئەوەی عوکاشە رضي الله عنه داوای لە پێغەمبەری خودا ﷺ کرد لەو حەفتا هەزار کەسەبێت کە بەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشتەوە ، عوکاشەی کوڕی محصن گوتی : (ادْعُ اللهِ أنْ يَجْعَلَنِي منهمْ) ، قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : ((أَنْتَ مِنْهُمْ)) متفق علیه .




واتە : ئەی پێغەمبەری خودا بۆم بپاڕێرەوە ، خودا لەو کەسانەم بگێڕێت ، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : تۆ لەو کەسانەیت بەبێ لێپرسینەوە دەچیتە بەهەشتەوە .

**پ٧٨/ جۆرەکانی تەوەسلی قەدەغەکراو لە دوعادا چییە ؟**

و٧٨/ ١ . تەوەسلی شیرکی : بریتییە لەو تەوەسلەی هاوبەش بڕیاردانی بۆ خودا تێکەڵ بووە ، وەك داوای بە هاناوەچوون لە پیاوچاکان ، وپاڕانەوە لێیان جگە لە خودا ، وەك ئەوەی دەڵێن : مەدەد یارسول الله ، یان مەدەد یاگەیلانی .

٢ . تەوەسلی بیدعی : بریتییە لە تەوەسل کردن بە شێوازێك بەڵگە شەرعییەکان بەڵگە نەبن لەسەری ، چونکە تەوەسل پەرستنە ، نابێت ئەنجام بدرێت بە بەڵگە نەبێت ، ولە تەوەسلی بیدعی تەوەسل کردنە بە زاتی پیاوچاکان وپلەوپایەیان .

**پ٧٩/ ئەو شەفاعەتە چییە کە لە ڕۆژی قیامەتدا دەکرێت ؟**

و٧٩/ بريتييه له نێوانگيری لای خودا بۆ بەدەستهێنانی سودێك بۆ كەسێك ، يان لادانی زيانێك لەسەر كەسێك .

**پ٨٠/ ئايا داوای شەفاعەت له مردووەكان دەكرێت ؟**

و٨٠/ داوای شەفاعەت له مردووەكان ناكرێت ، چونكه شەفاعەت موڵكی خودايه به تەنها ، خودا ﷻ دەفەرموێت : ﴿قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعٗاۖ ﴿٤٤﴾﴾(الزُّمَر).

واته : بڵێ شەفاعەت هەمووی بۆ خودايه .

**پ٨١/ مەرجەكانی شەفاعەتكردن چييه .**

و٨١/ مەرجەكانی شەفاعەتكردن دوو شته :

يەكەم : ڕوخسەتدانی خودا ﷻ بۆ ئەو كەسەی شەفاعەت دەكات بۆ ئەوەی شەفاعەت بكات ، خودا ﷻ دەفەرموێت : ﴿مَن ذَا ٱلَّذِی يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ ﴿٢٥٥﴾﴾(البَقَرَة).

واتە : کێ هەیە بتوانێت شەفاعەت ونێوانگیری بکات بەبێ ئیزنی خودا.

دووەم : ڕەزامەندی خودا لەو کەسەی شەفاعەتی بۆ دەکرێت ، خودا ﷻ دەفەرموێت : ﴿وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ ﴿٢٨﴾﴾(الأَنبيَاء).

واتە : شەفاعەت وتکاکاری ناکەن بۆ کەسێك نەبێت کە خودا لێی ڕازییە .

**پ٨٢/ شەفاعەت بۆ کێیە ؟**

و٨٢/ بۆ ئەهلی تەوحیدە ، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((أسْعدُ الناسِ بِشفاعَتِي يومَ القِيامةِ مَنْ قال : لا إلهَ إلّا اللهُ ، خالِصًا مُخلِصًا من قلْبِهِ)) رواه البخاری .

واتە : خۆشحاڵترین خەڵك بە شەفاعەتی من لە ڕۆژی قیامەتدا ، ئەو کەسەیە بڵێت : لا إله إلا الله ، بە ئیخلاصەوە لە دڵییەوە .

**پ٨٣/ حوکمی ئەو کەسە چییە کە گاڵتە بە خودا یان کتێبەکەی یان ئاینەکەی یان پێغەمبەرەکەی ﷺ بکات ؟**

و٨٣/ هەرکەسێك گاڵتە بە یەکێك لەوانە بکات حوکمی ئەوەیە کافرە ، خودا ﷻ دەفەرموێت : ﴿قُلْ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ ۝ لَا تَعْتَذِرُوا۟ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ ۚ ۝﴾(التَّوْبَة).

واتە : بڵێ : ئایا بە خودا وئایەتەکانی وپێغەمبەرەکەی گاڵتە ولاقرتی دەکەن ؛ پۆزش مەهێننەوە بێگومان ئێوە بێباوەڕ بوون دوای ئەوەی کە باوەڕتان هێنا بوو .

**پ٨٤/ مانای وەلاء وبەراء چییە ؟**

و٨٤/ وەلاء : سەرخستن وخۆشەویستییە بۆ خودا وپێغەمبەرەکەی ﷺ وموسڵمانان .

بە بەڵگەی ئەو فەرموودەی خودا ﷻ کە دەفەرموێت : ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمْ

رَٰكِعُونَ ﴿٥٥﴾ وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَإِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٥٦﴾﴾(المَائِدَة).

واتە : تەنها خۆشەویست وپشتیوانی ئێوە خودا وپێغەمبەرەکەی وباوەڕدارانن کە نوێژەکانیان بەوشێوەیە ئەنجام دەدەن کە فەرمانیان پێکراوە وزەکاتی سامانەکانیان دەردەکەن وملکەچن بۆ فەرمانەکانی خودا وکڕنوشی بۆ دەبەن ؛ وهەرکەسێك خودا وپێغەمبەرەکەی وباوەڕدارانی خۆش بوێت وئاینەکەی خودا سەربخات ، بێگومان حزبی خودا هەردەم براوە وبالادەستن .

وبەراء : ڕقە لە کوفر وبێباوەڕان ودژایەتی کردنیان .

بە بەڵگەی ئەو فەرموودەی خودا ﷻ کە دەفەرموێت : ﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُواْ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ ﴿٤﴾﴾(المُمْتَحنَة).

واتە : بێگومان پێغەمبەر ئیبراهیم وئەوانەی لەگەڵیدا باوەڕیان هێنابوو سەرمەشقێکی جوانن بۆ ئێوە ، کاتێگ بەگەلەکەیان گوت : بێگومان ئێمە بێبەرین لە ئێوە ولەوەی دەیپەرستن جگە لە خودا ، وبێباوەڕین ودوژمنایەتی ورِق لە نێوان ئێمە وئێوەدا بەرپایە وبەردەوامە ، هەتا باوەڕ بە خودای تاك وتەنها دەهێنن .

**پ٨٥/ حوکمی پیرۆزکردنی بێباوەڕان لە جەژنەکانیان چییە ، وەك جەژنی کریسمس بۆ نموونە ؟**

و٨٥/ شێخ ئیبن عوسەیمین رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت : پیرۆزبای کردن لە بێباوەڕان لە جەژنی کریسمس یان جگە لەوە لە جەژنە ئاینەکانیان حەرامە بە کۆڕا ، ئیبن قەیم رَحِمَهُ ٱللَّهُ لە کتێبی (أحکام أهل الذمة)دا ئەوەی باسکردووە . (فتاوی ابن عثیمین)(٣/٤٤).

**پ٨٦/ پێناسەی بیدعە بکە ؟**

و٨٦/ بریتییە لە پەرستنی خودا ، بە پەرستنێك پێغەمبەری خودا ﷺ وهاوەڵانی رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ ئەنجامیان نەداوە .




**پ٨٧/ حوکمی بیدعە لە ئایندا چییە ؟**

و٨٧/ حەرامە ولە تاوانە زۆر خراپەکانە .

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((**إنَّ خَيْرَ الحَدِيثِ كِتابُ اللهِ ، وخَيْرُ الهُدى هُدى مُحَمَّدٍ ﷺ ، وشَرُّ الأُمُورِ مُحْدَثاتُها ، وكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ**)) رواه مسلم .

واتە : بێگومان باشترین قسە فەرموودەی خودایە ، وباشترین هیدایەت هیدایەتی محمدە ﷺ ، وخراپترین کردەوە داهێنراوەکانن ، وهەموو بیدعەیەك گومڕاییە .

**پ٨٨/ ئایا لە ئیسلامدا بیدعەی حەسەنە هەیە ؟**

و٨٨/ لە ئیسلامدا بیدعەی حەسەنە نییە ؛ پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((**وكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ**)) رواه مسلم .

واتە : هەموو بیدعەیەك گومڕاییە .

**پ٨٩/ دەبێت هەڵوێست چۆن بێت بەرامبەر ئەهلی بیدع ؟**

و٨٩/ وریایی وئاگادارکردنەوەی خەڵك واجبە لە ئەهلی بیدع ، ووازهێنان لە دانیشتن لەگەڵیان وسەیرکردنی کتێبەکانیان ، ئیبن عەباس رضي الله عنهما دەڵێت : (لا تُجالِسْ أهْلَ الأهْواءِ ، فَإنَّ مُجالَسَتَهُمْ مَمْرَضَةٌ لِلْقُلُوبِ)(الإبانة)(٢/٤٣٨).

واتە : لەگەڵ ئەهلی بیدعە دامەنیشە ، چونکە دانیشتن لەگەڵیان هۆکاری نەخۆشی دڵە .

پێشەوا بەغەوی دەڵێت : هاوەڵان وتابعییەکان وتابعی تابعییەکان وزانایانی سوننەت کۆك وتەبان لەسەر دژایەتی کردنی ئەهلی بیدعە وهەجرکردنیان . (شرح السنة)(١/١٢٧).

**پ٩٠/ حوکمی ئەو کەسەی نوێژ ناکات چییە ؟**

و٩٠/ وازهێنان لە نوێژ کوفرە ، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی جابر رضي الله عنه کە دەڵێت : پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((إنَّ بيْنَ الرَّجُلِ وبيْنَ الشِّرْكِ والْكُفْرِ تَرْكَ الصَّلاةِ)) رواه مسلم .




واتە : بێگومان نێوان مرۆڤ وشیرك وكوفر وازهێنانە لە نوێژ[1].

**پ٩١/ حوكمی كافركردنی موسڵمانان بە ناحەق چییە ؟**

و٩١/ حەرامە ولە تاوانە زۆر خراپەكانە ، پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((أيُّما رَجُلٍ قالَ لِأخِيهِ يا كافِرُ ، فَقَدْ باءَ بِها أحَدُهُما ، إنْ كانَ كَما قالَ ، وإلّا رَجَعَتْ عَلَيْهِ)) رواه البخاري ومسلم .

واتە : هەركەسێك بە براكەی بڵێت : كافر ، یەكێكیان گیرۆدەی ئەو حوكمە دەبن ، ئەگەر قسەكەی جێی خۆی بێت ئەوە كافرە ، ئەگەرنا ئەو حوكمە دەگەڕێتەوە بۆ خۆی .

**پ٩٢/ واجبی موسڵمانان بەرامبەر هاوەڵانی پێغەمبەری خودا ﷺ چییە ؟**

---

[1]. زانایان ناكۆكن لە پرسی كەسێك نوێژ نەكات ، جمهوری زانایان دەڵێن : ئەگەر كەسێك لەبەر تەمبەڵی نوێژ نەكات وباوەڕی بە نوێژ هەبێت كە واجبە لەسەری ، كەسێكە تاوانی گەورەی ئەنجامداوە ، وهەڕەشەی توندی لەسەرە بۆ ئەوەی خودا ﷻ لە ئاگری دۆزەخدا سزای بدات ، بەڵام كافر نییە ولە دۆزەخدا بە هەمیشەی نامێنێتەوە ، ئەوە بۆچوونی شێخ ئەلبانی وشێخ عبيد الجابريیە لە زانایانی سەردەم . (وەرگێڕ).

و٩٢/ خۆشویستنیان واجبه ، وپێویسته باوەڕت وابێت باشترین خەڵكن دوای پێغەمبەران وڕەوانەكراوەكانی خودا ، وزمانت بگریتەوە لە قسە پێكردنیان ئیللا بە باشە نەبێت ، وحەرامە جنێو وقسەی نەشیاو بە یەكێك لە هاوەڵان بڵێیت ، پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((لا تَسُبُّوا أَصْحابِي ، فَوالذي نَفْسِي بيَدِهِ لو أنَّ أحَدَكُمْ أنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا ، ما بَلَغَ مُدَّ أحَدِهِمْ ، ولا نَصِيفَهُ)) رواه البخاری ومسلم .

واتە : جنێو وقسەی نەشیاو بە هاوەڵانم مەڵێن ، سوێند بەوكەسەی نەفسی منی بە دەستە ، ئەگەر كەسێك لە ئێوە بە ئەندازەی كێوی ئوحود زێڕ ببەخشێت ناگاتە ئەوەی یەكێك لەوان پڕمشتی یان نیوەی ئەوەی ببەخشیبێت .

**پ٩٣/ بەڵگە چییە لەسەر فەزڵی هاوەڵان رضي الله عنهم .**

و٩٣/ بەڵگە ئەو فەرموودەی خودایە سُبحانه وتعالى كە دەفەرموێت : ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ١٠٠﴾(التَّوبَة).




**واته :** پێشەنگەکان کە سەرەتا باوەڕیان هێنا لە کۆچەرییەکان وپشتیوانان وئەوانەی بە باشی شوێنیان کەوتن ، خودایان لێ ڕازی بوو ، وئەوانیش لە خودا ڕازین ، ولە بەهەشتدا چەندان باخی بۆ ئامادەکردوون کە ڕووبار وجۆگەلەی ئاو بە ژێریاندا دەڕوات ، بە هەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە ، ئەوە بردنەوەی گەورە ومەزنە .

**پ٩٤/ باشترینی هاوەڵان کێن ؟**

و٩٤/ باشترینی هاوەڵان چوار خەلیفەکەیە : ئەبوبەکری صدیق ، وعومەری کوڕی خەتاب ، وعوسمانی کوڕی عەفان ، وعەلی کوڕی ئەبوتالب ، پاشان ئەو شەش هاوەڵەی تر کە لەگەڵ چوار خەلیفەکە مژدەی بەهەشتیان پێدراوە رضي الله عنهم .

**پ٩٥/ مەبەست لە (ولاة الأمور) چییە ؟**

و٩٥/ مەبەست کاربەدەستانی موسڵمانانن .

**پ٩٦/ واجبی موسڵمانان چییە بەرامبەر کاربەدەستانی موسڵمانان ؟**

و٩٦/ واجبی موسڵمانان بیستن وگوێڕایەڵییە جگە لەوەی سەرپێچی فەرمانی خودایە ، وئامۆژگاری کردنیان وپاڕانەوە بۆیان ، ووازهێنان لە تانە لێدانیان لەسەر مینبەرەکان ولە کۆڕ ودانیشتنەکاندا ، لەبەر ئەو فیتنانەی لێی دەکەوێتەوە .

**پ٩٧/ بەڵگە چییە لەسەر ئەوە ؟**

و٩٧/ خودا ﷻ دەفەرموێت : ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ ٥٩﴾(النِّسَاء).

واتە : ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە گوێڕایەڵی خودا وگوێڕایەڵی پێغەمبەری خودا وکاربەدەستانتان بکەن .

وپێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((**الدِّينُ النَّصِيحَةُ ، قُلْنا : لِمَن ؟ قالَ : لِلَّهِ ولِكِتابِهِ ولِرَسُولِهِ ولِأئِمَّةِ المُسْلِمِينَ وعامَّتِهِمْ**)) رواه مسلم .

واتە : ئاین نەصیحەت ودڵسۆزییە ، گوتمان : بۆ کێ ؟ فەرمووی : بۆ خودا وکتێبەکەی وپێغەمبەرەکەی وکاربەدەستانی موسڵمانان وتێکڕای موسڵمانان .




**پ٩٨/ چۆن ئامۆژگاری کاربەدەستانی موسڵمانان دەکرێت ؟**

و٩٨/ بە نهێنی ئامۆژگاری دەکرێن ، پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ((مَن أرادَ أن يَنصَحَ لِذي سُلطانٍ فلا يُبدِهِ عَلانيةً ، ولَكِن يأخذُ بيدِهِ فيخلوا بهِ ، فإن قبلَ منهُ فذاكَ ، وإلّا كانَ قد أدّى الَّذي عليهِ)) رواه أحمد وغيره وصححه الألباني وابن باز رحمهم الله .

واتە : ئەگەر کەسێك ویستی ئامۆژگاری دەسەڵاتدار بکات بابە ئاشکرا دەرینەبڕێت ، بەڵکو دەستی بگرێت وبە تەنها ئامۆژگاری بکات ، ئەگەر ئامۆژگارییەکەی لیٚ وەرگرت باشە ، وئەگەر ڕەتیکردەوە ئەوەی پێویست بووە لەسەری بەجێی هێناوە .

**پ٩٩/ واجبی موسڵمانان لە کاتی سەرهەڵدانی فیتنەکان چییە بە بەڵگەوە ؟**

و٩٩/ واجبە لە فیتنەکان دووركەونەوە ، ودەست بە کۆمەڵی موسڵمانان وپێشەواکەیانەوە بگرن ، وپرسیار لە زانا دامەزراوەکان بکەن ، بە بەڵگەی ئەو ئایەتەی خودا ﷻ کە دەفەرموێت : ﴿وَإِذَا جَآءَهُمۡ أَمۡرٌ مِّنَ ٱلۡأَمۡنِ أَوِ ٱلۡخَوۡفِ أَذَاعُواْ بِهِۦۖ وَلَوۡ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنۡهُمۡ

لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْۗ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَٱتَّبَعْتُمُ ٱلشَّيْطَٰنَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٣﴾(النِّسَاء).

واتە : ئەگەر هەواڵێكیان دەربارەی ئاسایش یان ترس پێبگات بڵاوی دەكەنەوە ، بەڵام ئەگەر بیانگەڕاندایەتەوە بۆ لای پێغەمبەری خودا وزانایان ، ئەوانەی شارەزاییان هەبوو دەیانزانی چی شیاوی بڵاوكردنەوەیە وهەواڵی ڕاست وناڕاستیان لێك جوودا دەكردەوە ، وئەگەر فەزڵ وبەزەیی خودا نەبووایە شوێنی شەیتان دەكەوتن هەندێكی كەمتان نەبێت .

**پ١٠٠/ ئەهلی سوننە وجەماعە كێن ؟**

و١٠٠/ ئەوانەن دەستیان گرتووە بە سوننەتی پێغەمبەری خوداوە ﷺ وئەوەی هاوەڵان لەسەری بوون ، وئەوەی شوێنیانكەوتووە ، وڕێبازی ئەوەی گرتووە لە بیروباوەڕ وگوفتار وكردار .

درود وسەڵام لەسەر پێغەمبەرمان محمد ، ولەسەر ئەهل وهەموو هاوەڵانی .

